# ڕێگاکانی هاك و خۆپاراستن




ئامادەكردنی:

**محمد بهرام احمد**


## بۆ هەر پرسیارێك ئەتوانن پەیوەندیم پێوەبکەن:

بۆ بابەتی زیاتر ئەتوانن سەردانی ماڵپەری ماڵێك بۆ تەكنەلۆژیا بكەن

ماڵێك بۆ تەكنۆلۆژیا
Www.Home4T.coM

**MuhamaD BosS**

# بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکیەك لەسەر هاك و خۆپاراستن

پێش ئەوەی هەر ئامێرێك بەكاربهێنین سەرەتا پێویستە بزانیت چۆن خۆمان بپارێزین،بۆ ئەمەش پێویستە بەدوای رێگاكانی خۆپاراستندا بگەرێیت یاخود پرسیار لە كەسانی شارەزا بكەیت و كەمێك شارەزایی لەوانەوە وەرگریت چونكە ئەوان ناتوانن هەموو زانیاریەكانمان پێبخەشن دڵنیاشبە هیچ كەسێك ئامادە نییە بەخۆرایی زانیاریت پێببەخشێت،بۆیە لەم حاڵەتەدا پێویستە زۆر وریابیت چونكە سەردەمەكە وایلێهاتوە ناتوانیت بڕوا بە هیچ كەسێك بكەیت تەنانەت نزیكترین هاورێشت،لێرەیا باسی رێگاكانی خۆپاراستن ئەكەین كە چۆن بتوانین خۆمان بپارێزین و شارەزاییەكی باش پەیدابكەین بەبێ ئەوەی داوا لە هیچ كەسێك بكەین یاخود بە نەزانی ئامێرە زیرەكەكان بەكار نەهێنین.

هەر ئامێرێك پەیوەست بكرێت بە ئینتەرنێتەوە ئەگەری هاككردنی هەیە بۆیە ئەتوانین بڵێین هەموو شتێك ئەگەری هاككردنی هەیە بەو مەرجەی پەیوەستی ئینتەرنێت ببێت.



لێرەیا وەڵامی پرسیارە باوەکان ئەدەینەوە وە باسی ڕێگاکانی خۆپاراستن ئەکەین:

چۆن خۆمان بپارێزین لە هێرشی هاك؟

چۆن بزانین هاك کراوین؟

چۆن لینکی هاك بناسینەوە؟

چۆن ئەکاونتەکانمان بە پارێزراوی بهێڵینەوە؟

چۆن مۆبایلەکەت ئەپارێزی لە هێرشی هاك؟

چیبکەین کاتێك هاك ئەکرێین؟

هاککەر کێیە؟

کراککەر کێیە؟

دوای هاککردنی ئەکاونت ئەگەری گەراندنەوەی هەیە؟

هاك ئەکرێن (Viber,Whatsapp,Telegram,WeChat,Line)؟

چی جۆرە پاسۆردێك ئەگەری هاککردنی کەمە؟

ئایا ئەکرێ تەنیا لە ڕێگای کردنەوەی لینکەوە هاك بکرێین بەبێ داگرتنی هیچ شتێك ؟

ئایا ئەشکێ 2step verification؟

ئایە چی سیستەمێك 100% پارێزراوە؟

هاککەر چی بەرنامەیەك بەکارئەهێنێ؟

ئەکرێ بەبێ بەکارهێنانی دژە ڤایرۆس پارێزراوبین؟

لەنێو کوردا هاککەری شارەزا هەیە؟

ئەو بەرنامانەی کراك ئەکرێن پارێزراون بۆ بەکارهێنان؟

کام لە ئەنتیڤایرۆسەکان گونجاون بۆ بەکارهێنان؟

**چۆن بزانین بەرنامەیەك هاکە بەبێ بەکارهێنانی هیچ شتێك (مەرج نییە هەمو کاتێك راستبێ)**

**دروستکردنی ئەکاونت لە بازار لەلای خاوەن دوکانەوە تا چەند گونجاوە؟**

**ئایە کۆمپانیاکانی وەك(گوگڵ،فەیسبوك،یوتوب،تویتەر ....هتد) ئەتوانن چاودێریمان بکەن؟**

## هاککەر کێیە؟



**هاککەر ئەو کەسەیە کە بتوانێت فیکرە و داهێنان دابرژێت شتێك بکات کە دوبارە نەکرابێتەوە.**

**هاکەر ئەو کەسەیە بتوانێت پرۆگرام سازی بکات و کۆد بنوسێت لە بوارێکدا کە پەیوەندی**

**بە هاکەوە هەبێت کونێك یا درزێك لە پرۆگرامێك یا سیستەمێك یا سایتێك بدۆزێتەوە.**

## كراككەر كێیە؟



**كراككەر بریتین لەكەسانەی كەوا سیستەمی بەرنامە یان پرۆگرامێک تێک دەشكێنن واتا بەشێوەیەكی نا یاسایی دەستكاری سیستەمی پرۆگرامێک یان بەرنامەیەک یان یارییەک دەكەن و گۆرانكاری تێدا دەكەن.**

## چۆن خۆمان بپارێزین لە هێرشی هاككەر؟



1-پێویستە دوربکەویتەوە لە سایتە بەدرەوشتەکان چونکە یەکێك لە ڕێگاکانی هاککردن بەکارهێنانی سایتە بەدرەوشتەکانە لەلایەن زۆرینەی خەڵکەوە بە تایبەت لە وڵاتە ئیسلامیەکان.

2-بەکارنەهێنانی ئەو بەرنامانەی کە کراك کراون یاخود ئەو فایلانەی کە ئەبێتە هۆی کراك کراکردنی بەرنامەیەك.

3-پێویستە زۆر بە ئاگابیت لەکاتی کردنەوەی هەر لینکێك چونکە زۆرجار لە ڕێگای لینکەوە خەڵك هاك ئەکرێ(دوای کردنەوەی لینکەکە چەند کارێك ئەنجام ئەدەی نەوەك تەنیا بە کلیك کردن لە لینکەکە،ئەکرێ بە تەنیا کلیکێك هاك بکرێی بەڵام ئەم ڕێگایە لەلایەن کوردەوە بەکارنایەت چونکە شارەزاییەکی ئەوتۆیان نییە لە بواری هاك).

4-ئاگاداری ئەو ئیمەیڵەبە کە بەکاریئەهێنی و تایبەت بەخۆت لەکاتی دروستکردنی ئەکاونت لە هەر سایتێك پێویست ناکا هەمان پاسۆردی ئیمەیڵەکە بەکاربهێنی چونکە زۆرجار ئەبێتە هۆی هاککردنی ئیمەیڵەکەت.

## دانانی وشەیەکی نهێنی بەهێز:

1-ناوی خۆت و کابراو هیچ کەسێك نەبێ.

2-موالید نەبێ.

3-شتێکی وابێ هیچ پەیوەندیەکی بەتۆوە نەبێ.

4-پاسۆردی جیا بەکاربهێنە بۆ هەمو ئەکاونتەکانت.

5-مانگی جارێك پاسۆرد بگۆرە.

6-پێکهاتبێ لە ژمارەو پیت و هێما و بۆشایی.

7-ناوێك بێ لە هیچ شوێنێك نەدۆزرێتەوە.

8-هەوڵدە پاسۆردەکە زیاتربی لە 8 پیت و ژمارە.

## بۆ ئەوەی پاسۆردەکەت پارێزراو بێ:

1-پاسۆردەکە بۆ هیچ کەسێك مەنێرە لە ڕێگای ئیمەیڵ بێ یان فەیسبووك و هتد....

2-هەوڵبدە پاسۆردەکەت لە ئیمەیڵ هەڵگرە واتا لەوێ سەیڤی بکە یاخود لە OneDrive.

3-پاسۆردەکەت بە هیچ کەسێك مەڵێ تەنانەت بە خێزانەکەشت مەڵێ(واباشترە).

## چۆن بزانین هاك کراوین؟



**ڕێگا زۆرە تاوەکو بزانیت هاککراویت یاخود نا، لێرەیا باسی ئاسانترین ڕێگا ئەکەین**

**سەرەتا لە**

**ئەنوسی RUN**

**system.ini**

**دواتر پەنجەرەیەکت بۆ ئەکرێتەوە**

**ئەگەر ئەمەی * تیابو واتا هاککراویت ئەگەر تیای نەبوو هاکنەکراوی**




```
; for 16_bit app support
[386Enh]
woafont=dosapp.fon
EGA80WOA.FON=EGA80WOA.FON
EGA40WOA.FON=EGA40WOA.FON
CGA80WOA.FON=CGA80WOA.FON
CGA40WOA.FON=CGA40WOA.FON

[drivers]
wave=mmdrv.dll
timer=timer.drv

[mci]
```

-یاخود نامەیەکی ئاگاداریت پێ ئەگا.

-یاخود دژە ڤایرۆسێکی ساختە.

-یاخود چەند لینکێکی نەخوازراوت بۆ ئەبێتەوە لە براوسەر.

-پاسۆردەکانت ئەگۆڕێ.

-بەبێ ویستی خۆت ماوسەکە ئەجوڵێت.

-لەکارکەوتنی بەشەکانی:

Registry Editor

Task Manager

-لە فەیسبوک یاخود لە ئیمەیڵەکە نامەیەکت پێ ئەگا بۆ داگرتنی ئەنتیڤایرۆس یاخود بەرنامە.

## چۆن لینکی هاك بناسینەوە؟



**ئەتوانی لە ڕێگای ئەم سایتانەوە لینکەکان بپشکنی:**

https://safeweb.norton.com/

https://www.urlvoid.com/

https://www.psafe.com/dfndr-lab/

https://www.virustotal.com/gui/home/url

https://transparencyreport.google.com/safe-browsing/search?hl=en

**بەبێ کردنەوە لینکەکە کۆپی بکەو لەم سایتانە دایبنێ ئەگەر هاکبو ڕاستەوخۆ ئاگادارت ئەکاتەوە.**

## ئایە هیچ سیستەمێك لە 100% پارێزراوە؟




هیچ سیستەمێك پارێزراو نییە هەموو سیستەمێك ئەگەری هاككردنی هەیە.

NO SYSTEM IS SAFE

بەڵام لێرەیا 10 سیستەم هەیە دڵنیایی زیاترت پێئەدەن:

OpenBSD

Linux

Mac OS X

Windows Server 2008

Windows Server 2000

Windows 8

Windows Server 2003

Windows XP

HP-UX 11i

Solaris

## ئەكرێت بەبێ بەكارهێنانی دژە ڤایرۆس پارێزراوبین؟




بەڵێ ئەكرێت بەڵام ئەبێت شارەزاییەكی تەواوت هەبێت و بتوانی خۆت بپارێزی،وەك چۆن هاككەر پێش ئەوەی ببێت بە هاككەر ئەبێت فێربێ چۆن خۆی بپارێزێت ئینجا ئەتوانێ ببێت بە هاككەر.

## لەنێو كوردا هاككەری شارەزا هەیە؟



نەخێر تەنیا مشەخۆرن،هاککەر خۆی بەرنامە دروست ئەکات و رێگای ئەدۆزێتەوە نەوەك بچێت لە یوتوب بەدوای فێرکاریەوە بێ.

## دروستکردنی ئەکاونت لە بازار لەلای خاوەن دوکانەوە تا چەند گونجاوە؟




هەڵەیەکی باوە کە تاوەکو ئێستاش خەڵك ئەچێت لە بازار ئەکاونت دروست ئەکات بەبێ ئەوەی کەسێکی شارەزا ئاگادار بکاتەوە، ئەگەر ناتوانیت ئەکاونت دروست بکەیت ئەتوانی لە کەسێکی شارەزا بپرسیت کە شارەزاییەکی تەواوی هەبێت لەو بوارە بەو مەرجەی فێرت بکات نەوەك بۆت دروست بکات.

## ئەو بەرنامانەی کراك ئەکرێن پارێزراون بۆ بەکارهێنان؟



**نەخێر زۆربەی زۆری سێرڤەری لەگەڵ تێکەڵ کراوە،بەڵام ئەوە بزانە هەموو بەرنامەیەکی کراك کراو دژە ڤایرۆس ئەیگرێت.**

## ئایا ئەکرێ تەنیا لە رێگای کردنەوەی لینکەوە هاك بکرێین بەبێ داگرتنی هیچ شتێك؟



بەڵێ ئەکرێت تەنیا بە کردنەوەی لینکێك هاك بکرێیت بەبێ ئەوەی هیچ فایلێك داگریت

هاککەر هەڵئەستێت بە دروستکردنی لینکێك کە بتوانێت بە ئاسانترین رێگا مۆبایلەکەت هاك بکا

کاتێ کلیك لەو لینکە ئەکەیت هیچ فایلێك داناگیرێ

دوای داخستنی براوسەرەکە هاککەرەکە هیچ دەسەڵاتێکی نامێنێت

بەڵام ئەگەر هاککەرێکی زیرەك بێت دوای داخستنی براوسەرەکەش ئەتوانێت کارەکانی خۆی بکات

هاککەرەکە ئەتوانێت دەست بگرێت بەسەر(ناوەکانی نێو مۆبایلەکەت،نامەکان،شوێنت).

## کام لە دژە ڤایرۆسەکان گونجاون بۆ بەکارهێنان؟



**دژە ڤایرۆسەکان دڵنیایی تەواوت پێنادەن کە پارێزراوبی لە هێرشی هاك زۆربەی کارەکە ئەکەوێتە سەر هۆشیاری بەکارهێنەر.**

**ئەمە ریزبەندی باشترین دژە ڤایرۆسەکانن بۆ ساڵی 2019**

[Bitdefender Antivirus Plus 2020]

[Norton AntiVirus Plus]

[Webroot SecureAnywhere AntiVirus]

[ESET NOD32 Antivirus]

[F-Secure Antivirus SAFE]

[Kaspersky Anti-Virus]

[Trend Micro Antivirus+ Security]

[Panda Dome Essential]

## ئایە کۆمپانیاکانی وەك(گوگڵ،فەیسبوك،یوتوب،تویتەر ....) ئەتوانن چاودێریمان بکەن؟

**بەڵێ ئەتوانن ئاگاداری هەموو ئەو کارانە بن کە ئەیکەیت و پارەکەت لە چیدا سەرف ئەکەیت(ئەتوانن بزانن ئەچیتە چی شوێنێك،یاخود چی کارێك ئەنجامئەدەیت،ئەتوانن کامێراکەت بەکاربهێنن بەبێ ویستی خۆت،ئەتوانن گوێبیستی هەموو ئەو قسانەبن کە ئەیکەیت.....هتد).**

## چۆن بزانین بەرنامەیەك هاکە بەبێ بەکارهێنانی هیچ شتێك (مەرج نییە هەمو کاتێك راستبێ)



**لەوانەیە وابیر بکەیتەوە شتێکی مەحاڵبێت بەبێ بەکارهێنانی دژە ڤایرۆس فایلێکی هاك بناسیتەوە.**

**لێرەیا چەند رێگایەك هەیە ئەتوانیت فایلی هاك بدۆزیەوە بەبێ ئەوەی دژە ڤایرۆس بەکاربهێنیت:**

هەر لینکێکیان بۆ ناردیت ئەگەر راستەوخۆ بکەیتەوە داوای ئیمەیڵ و پاسۆردی ئەکاونتێکی کرد بزانە کە هاکەو داخیلی مەکە(بۆ نمونە:
فەیسبوك،یوتوب،سناپچات،ئینستاگرام،جیمەیڵ).

بۆ نمونە کاتێ بەرنامەیەك یاخود یاریەك دائەگریت بە مۆد کراوی(هاککراوی) ئەبێ سەیری کێشی بەرنامەکە بکەیت کە ئایە ئەمە قەبارەی فەرمی ئەم بەرنامەیەیە یاخود نائاساییە چەند مێگابایتێکی کەم کێشی بەرنامەکە زیادبکات، بۆ ئەوەی بزانی کێشی یاریەکە چەنە ئەتوانیت سەیری ئەو سایتانە بکەیت کە یاری یاخود بەرنامە بە مۆد کراوی بڵاوئەکەنەوە، لەوێدا سەیری بکە بزانە هەمان شتە(سایتە بڕواپێکراوەکان).

هەر بەرنامەیەك ئایکۆنی نەبو ئەوا دڵنیابە کە ئەمە هاکە.

## Two-Factor Authentication ئایا ئەشکێ؟



بەڵێ ئەشکێ بەڵام تەنیا لەلایەن هاککەرە زیرەکەکانەوە(تێپەراندنی ئەم سیکوێرتیە زیرەکیەکی زۆری ئەوێ واتا کارێکی ئاسان نییە بۆیە دڵنیام لەنێو کوردا کەسی وامان نییە بتوانێ ئەم سیکوێرتیە بشکێنێ).

## چۆن ئەکاونتەکانمان بە پارێزراوی بهێڵینەوە؟



رێگاکانی پاراستنی ئەکاونت زۆرن لێرەیا باسی چەند رێگایەك ئەکەین بۆ پاراستنی ئەکاونتەکەت لە هێرشی هاککەران:

1-دانانی پاسۆردێکی بەهێز(هەوڵبە کەمتر لە 3 مانگ پاسۆردەکە بگۆریت).

2-دانانی سیکوێرتیەکی بەهێز.

3-دانانی ژمارە مۆبایل و ئیمەیڵ و چاڵاککردنیان.

4-هەوڵبە دوربکەویەوە لەو پەیجانەی کە بابەتی نەشیاو بڵاوئەکەنەوە.

5-دانانی Two-Factor Authentication بۆ ئەکاونت.

6-زانیاریەکانی ئەکاونتەکەت تەنیا لەلای خۆتبێت و مەیدە بە هیچ کەسێك.

7-داوا لە هیچ کەسێك مەکە ئەکاونتت بۆ دروست بکە خۆت هەوڵبە و فێریبە.

## (Viber,Whatsapp,Telegram,WeChat,Line) هاك ئەکرێن؟




بەڵێ هەموویان ئەگەری هاککردنیان هەیە.

## چیبکەین کاتێك هاك ئەکرێین؟




1-گۆڕینی پاسۆردی ئەکاونتەکانت،لێرەیا ئەتوانی باشترین پاسۆرد بەدەست بهێنیت

https://nordpass.com/password-generator/

2-سرینەوەی ئەو بەرنامانەی جێگای گومانن.

3-هاورێکانت لەوە ئاگاداربکەرەوە کە ئەو لینکانە نەکەنەوە کە تۆ بۆیان ئەنێری بەبێ ئەوەی ویستت لەسەربێت

4-راگرتنی بەشی بڵاوکردنەوەی ئینتەرنێت بۆ خەڵکانی چواردەورت چونکە ئەمە ئەبێتە رێگایەکی ئاسان بۆ هاککەران بۆ ئەوەی بتوانن هاکت بکەن.

5-دژە ڤایرۆسێکی بەهێز دانێ بۆ مۆبایلەکەت و راستەوخۆ مۆبایلەکەت بپشکنە.

6-یاخود ئەتوانیت رێگای فۆرمات کردن بەکاربهێنیت لەو کاتەی رێگاکانی سەرەوە سودی نەبوبێت.

## دوای هاککردنی ئەکاونت ئەگەری گەراندنەوەی هەیە؟




بەڵێ بەو مەرجەی پێشتر ئیمەیڵێکت لەسەر ئەکاونتەکەت دانابێ و چالاکت کردبێ و ئەو ئیمەیڵەت لامابێت، ئەگەر شارەزاییەکی باشت نییە باشترە کەسانی

شارەزا ئاگادار بکەیتەوە بۆ ئەوەی بە زوترین کات ئەکاونتەکەت بۆ بگەڕێننەوە بەبێ ئەوەی کارێکی نەشیاو لە ئەکاونتەکەت بکرێت.

## هاککەر چی بەرنامەیەك بەکارئەهێنێ؟




زۆربەی هاککەران زیاتر ئەم بەرنامانە بەکارئەهێنن بۆ کارەکانیان:

Metasploit

Wireshark

NMAP

Burp Suite

OWASP ZAP

Nikto

SQLmap

## چۆن مۆبایلەکەت ئەپارێزی لە هێرشی هاك لە شوێنە گشتیەکان؟



1-بەشی بڵاوکردنەوەی ئینتەرنێت دابخە.

2-وایفایەك بەکارمەهێنە کە لێی دڵنیانیت،ئەگەر ئینتەرنێتی دەرەوەش بەکارئەهێنیت بۆ نمونە لە کافتریاکان کە زۆرینەی خەڵك بەبێ ئەوەی ئاگاداری مەترسیەکانی بێت بەکاری ئەهێنن،ئەگەر بەکاریشت هێنا بەبێ (ڤپن) بەکاریمەهێنە.

3-بەشی بلوتوز داخە.

4-دانانی پاسۆردێکی بەهێز بۆ مۆبایلەکەت.

5-هەرگیز مۆبایلەکەت بەجێمەهێڵەو بەو کەسانەی ئەوێ بڵێی دەستی لێمەدەن چونکە ئەگەر بەکاریبێهنن تۆ ئاگادار نیت کە ئەوان چی ئەکەن.

6-هیچ لینکێك یاخود نامەیەك مەکەوە کە پێتئەگا کاتێك دڵنیانیت لە لینکەکە.

7-هەموکات (ڤپن) بەکاربهێنە.

8-هیچ شتێك لەو سایتانە دامەگرە کە لێی دڵنیانیت.

9-دانانی دژە ڤایرۆسێك کە ئەتپارێزێت لە هاککەران.

# زانیاری:



1-کاتێك ریکلام یەتە سەر شاشە یاخود کاتێك سایتێك ئەکەیتەوە ریکلامێکی زۆری تیایە داوات لێ ئەکات بەرنامەیەك داگریت بەبێ ئەوەی ئاگاداریبیت ئەم بەرنامەیە یەت ئەبێ زۆر ئاگاداربی کە ئەم بەرنامەیە دانەگریت(زۆرجار کاتێك ئەتەوێ بەرنامەیەك داگریت وای لێیەت بۆ ئەوەی لێت تێکەڵ بێت نەزانیت کامەیان راستەقینەیە).

2-ئاگاداری ئەو پەیجانەبن کە هەواڵی درۆینە بڵاوئەکەنەوە یاخود بۆ ئەکتیڤ خەڵاتی درۆیینە دا ئەنێن بەناوی کەناڵێك یاخود بەناوی کەسێکی بەناوبانگ.

3-دوای تەواوی بونی چات لەگەڵ کەسێك ڕاستەوخۆ چاتەکە بسرەوە،ئەپرسیت بۆ؟

لەم چاتەیا وێنە یاخود ئیمەیڵ و پاسۆردت بۆ هاوڕێیەکت ناردوە یاخود شتێکی گرنگت بۆ ناردوە هەرکاتێك یەکێکتان هاك بکرێن هەموو زانیاریەکانتان ئەچێتە لای هاککەر(بە تایبەت بۆ کچان پێویستە رۆژانە یاخود هەفتانە چاتەکان بسرنەوە).

یەکێك لە کارەکانی هاککەر ئەچێتە بەشی چاتەکان ئەگەرێ بەدوای زانیاری زۆرجار پێویستی بە شتێك ئەبێ لەنێو ئەو چاتە ئەیدۆزێتەوە بەهۆیەوە هاککەر ئەتوانێت دەست بەسەر زانیاریەکانت دابگرێت.

4-مواليدی ئەکاونتەکانت جیابێت: پێویست ناکات مواليدی ئەکاونتەکانت وەك یەکبێت بە تایبەت بۆ ئەوانەی کە گەیمەرن چونکە لەکاتی هاککردنی ئەکاونتەکەت ئەتوانێت سەیری ئەکاونتەکانی دیت بکاو بتوانێت مواليدەکەت بدۆزێتەوە.

5-ڕۆژانە سەیری ئیمەیڵەکەت بکە بۆ ئەوەی ئاگاداری نوێکاریەکان بیت.

6-دوربە لە بەکارهێنانی ئەو سایتانەی بۆ زیادکردنی فۆڵۆو،لایك،کۆمێنت..هتد بەکاردێن.

7-متمانە بە خۆشەویستەکەشت مەکە بۆ ئەم کارانە.

لێرەیا ئەتوانن سوود لەم بابەتانە وەربگرن:

## کۆکراوەی 310 پرسیارو وەڵامی تەکنەلۆجی

## چۆنیەتی پاراستنی هەموو ئەکاونتەکانت لە هاککردن لە یەك بابەتدا

لە کۆتایدا تەنیا ئەوە ئەڵێم ئینتەرنێت جیهانێکی زۆر قوڵە بە نەزانی بەکاریمەهێنە ئەگینا توشی زۆر کێشە ئەبیت کە هەرگیز چاوەڕێت نەکردوە هیوام وایە سودێکم پێتان گەیاندبێ،سەرکەوتوبن.

